زنجیرەی مێژوو بۆ لاوان(٩)

ناوی کتێب: شۆڕشی ڕوسیا

نووسەر: داڤید کیلێنگرەی

وەرگێڕ: ئاگری ئەفشین

چاپ: ئەلکترۆنی

ساڵ: ٢٠١٧

**ناوەڕۆك:**




ئیمپراتۆری ڕوسیا لە ساڵی ١٩١٧

## پێشەکی:

لە کۆتایەکانی سەدەی نۆزدەیەم ڕوسیا بەرفراوانترین وڵاتی جیهان بوو. سەرزەویەکەی لە ئا سیای ناوەڕا ست و سیبیر یەوە تا زەر یای هێمنی گرتبووەوە. زۆر بەی ئەو سەرزەویە ڕوسەکان لە سەدەی حەڤدەیەم تا نۆزدەیەم داگیریان کردبوو. نیوەی خەڵکی ڕوسیا کە ١٣٠ ملیۆن بوون لەو کا تە لە نژادی ڕوس بوون، نیوە کەی دیکە نە تەوە کانی دیکەی لە خۆگرتبوو، وەکوو پۆ ڵە ندی، فینلاندی، ئۆکرانی، ئوزبەکی و تاتار، کە بە زمانی جیاواز قسەیان دەکرد. هەندێك لەوانە باوەڕیان بە کەلیسای ئۆرتودۆکسی ڕوسیە هەبوو، بەڵام ڕێژەیەکی زۆریشیان باوەڕیان بە کاتۆلیك هەبوو کە خۆیان وابەستە بە کەلیسای ڕۆمی دەزانی، بە شێك لە خەڵکەکەی مو سڵمان و بودایی بوون. زۆرێك لەم نەتەوانە ئارەزویان بوو کە ڕۆژێك خۆیان لە ژێر جڵەوی حوکمڕانی ڕوسیا ڕزگار بکەن.

## ڕوسیای وەرزێری (جوتیاری)

گەرچی ڕوسیا سوپایەکی گەورەی هەبوو و وادەهاتە پێش چاو کە بەهێزترین وڵاتی جیهانە، بەڵام خاڵی لاوازی زۆری هەبوو، و لە بەرامبەر وڵاتانی پیشەسازی دیکەی جیهان وەکوو بەریتانیا و ئەڵمان، بە وڵاتێکی دواکەوتوو ئەژمار دەکرا. بۆ نموونە پیشەسازیە نوێیەکان لە ڕوسیە زۆر درەنگتر کەوتنە گەڕ لە چاو وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەوروپا بۆیە ناچار خۆی بە ئەوانەوە هەڵواسیبوو. ڕوسیا هێشتا زیاتر پشتی بە کشتوکاڵ دەبەست. ٩٠٪ خەڵکەکەی وەرزێر بوون. ئەم ڕێژەیە لە لادێکان دەژیان و لە سەر پارچە زەوی بچووك یان لە کێڵگەی گەورەی گەنم لە باشوری وڵات کاریان دەکرد. تا ساڵەکانی ١٨٦٠ نزیکەی زۆربەی وەرزێرە روسیەکان ڕەعیەت بوون. ڕەعیەت بوون بەو مانایەی کە ناچار بوون بۆ خاوەن موڵکێك و لەسەر زەویەکەی ئەو کار بکەن" جوتیارێکی لەو جۆرە وابەستە بوو بە زەوی خاوەن موڵکەکە و ئیتر نەیدەتوانی ئەو زەویە جێ بهێڵێت. لەو ڕۆژگارەدا ڕێژەیەکی زۆر کەم لە



قات وقوڕی ١٨٩٢ له یەکێك لە گوندەکانی ناوچەی ڤۆڵگا. ڕێکخراوێکی خێرخوازی خواردن دەدات بە خەڵکەکە. قات وقوڕی تەواوی وڵاتی گرتبووەوە و ببوە هۆی سەرهەڵدانی شۆڕشی جوتیاران.

وەرزێرەکان خاوەنی ئەو زەویانە بوون کە کاریان تێدا دەکرد. زۆربەی زەویەکان یان لە بەردەستی دەربار بوو یان کەلیسا بەسەری ڕادەگەیشت یاخود هی بازرگان و ئاغاکان بوون. کاتێك لە ساڵی ١٨٦١ ڕەعیەتەکان ئازادیان وەدەستهێنا هەندێك لەوان زەویان کڕی و سامانێکیان بۆ خۆیان پێکەوە نا. بەڵام هەندێکیان هەروا بە نەداری مانەوە و بگرە هەندێکیان بارودۆخیان خراپتریش بوو. ژمارەی دانیشتوان بە خێرایی ڕووی لە زیادبوون کرد بەڵام ئەو زەویەی لە دەستی جوتیارەکان بوو کیفایەتی بۆ حاڵی ئەوان نەدەکرد. زۆربەی وەرزێرەکان بوونە کرێکاری بێ زەوی و هەندێکی دیکە ڕوویان کردە پیشەسازی نوێ بۆ ئەوەی کار پەیدا بکەن. کارخانە پیشەسازیە نوێیەکان زۆرجار لە چواردەوری لادێکان و لە شارەکان دروست دەکران.

## پیشەسازی نوێ

لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەیەم ڕوسیە دەستی کرد بە بونیادنانی پیشەسازی نوێ. پارە و پێداویستی بۆ بونیادنانی بینای پیشەسازی نوێ، کەڵك وەرگرتن لە کانەکان و ڕێگای ئاسنی، وڵاتانی پیشەسازی ڕۆژئاوای ئەوروپا دابینیان دەکرد. واتە زۆربەی پیشەسازی ڕوسیا وڵاتانی دیکە خاوەنداریتیان دەکرد. ڕوسیە پارەی ئەم پێداویستیانەی بە هۆی هەناردەکردنی گەنم و دار دەستەبەر دەکرد و ماڵیات وەرگرتنیش لە جوتیارەکان بەشێکی داهاتەکەی بوو، کە هەموو ئەم پارەیە دەدرا بە وڵاتانی دەرەوە. بەشی زۆری ئەم پیشەسازیانە لە مۆسکۆ و سەنت پەتریسبۆرگ(لینینگراد) بونیاد نران. کرێکارەکان لە ژێر زەمینەکان ژیانیان بەسەردەبرد و لە بارودۆخێکی نەمر نەژی لە کارخانەکان کاریان دەکرد. کارخانەکانی ڕوسیا لە ڕیزی کارخانە گەورەکانی جیهاندا بوون. هەزاران ژن و پیاو لە هەر کارخانەیەك کاریان دەکرد. ئەم کارخانانە باشترین شوێن بوو بۆ ئەوەی



زەحمەتکێشەکان بە کەوچکی دار لە قاپێکدا خواردن دەخۆن. ئەم وێنەیە لە ساڵی ١٩٠٥ لە سەن پترسبۆرگ کیشراوە.

هەوڵیان دەدا چاکەخوازی بکەن، دەکەوتنە زیندانەکان یان دووردەخرانەوە.

شۆڕشگێڕەکان سەندیکای کرێکاری تێدا دروست بکەن و پلانی شۆڕش هەر لەوێڕا دابڕێژن.

لە لوتکەی حکومەتی ڕوسیە، تەزار نیۆکۆلای دووەم پادشای وڵات بوو( ماوەی پاشایەتیەکەی لە ساڵی ١٨٩٤ تا ١٩١٧). ئەوە بەو واتایە بوو کە ئەو دەیتوانی هەر کەسێك بیهەوێ پلەی بەرزبکاتەوە و کاروباری وڵاتی بداتە دەست وهەر کەسێکیشی بە دڵ نەبێت وەلای نێ" کاروباری مەملەکەت لە دەستی ئەودا بوو و بە ویستی ئەو هەڵدەسوڕا. ئەو کەسێکی ناشایستە بوو و لایەقی ئەو کارە نەبوو. دەیگوت کە خودا ئەوی هەڵبژاردووە بۆ حکومەت کردن بە سەر خەڵکی ڕوسیا. نەیدەویست لە وڵاتەکەیدا پەرلەمانی خەڵك هەبێت و کەس لە کاوبارەکانیدا شەریك بێت. زۆربەی ئاغا و دەربەگەکان و پیاوانی کەلیسا کە دەستیان لە بەڕێوەبردنی مەملەکەتدا هەبوو لە گەڵ تەزار هاوڕا بوون. و ئەوانەشی کە لەگەڵ تەزار ناکۆك بوون یان



تەزار نیکۆلای دووەم  و کوڕە تاقانەکەی ئالکسیۆس.

## شۆڕشگێڕان

لە کۆتایەکانی سەدەی نۆزدەیەم ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ڕوسیە بە تایبەتی گەنجەکان و خوێندەوارەکان لە فکری چارەسەری کێشە ناوخۆیەکاندا بوون. ئەوان دەیانویست کێشەی هەژاری بنەبڕ بکەن و ڕوسیا لە دەست ئەم حکومەتە ستەمکار و گەندەڵە ڕزگار بکەن. هەندێك لە خەڵکی دەوڵەمەند وەکوو پارێزەرو بازرگانەکان هومێدەوار بوون کە بە شێوەی ئاشتیانە گۆڕانکاری و چاکسازی بکرێت. بازێکیش پێیان وابوو کە وڵات ئەوەندە بارودۆخی خراپە کە چاککردنی بارودۆخەکە بە شێوەی ئارام و هەنگاو بە هەنگاو هیچ بە هیچ ناکات. ئەوان پێیان وابوو کە تەنها شۆڕش دەتوانێ ڕوسیە لە لەناوچون بپارێزێت. بۆ دەستپێکی شۆڕش چەندین ڕێگەیان خستبووە ئاراوە. هەندێك لە شۆڕشگێڕەکان ڕازی بوون بە تیرۆر کردن، ئەوان پێیان وابوو کە تەنها بە لە نێوبردنی سیاسەتمەدارەکان و دەربەگەکان دەکرێت دەست بە شۆڕش بکەن. هەندێکی دیکە پێیان باش بوو کە جوتیارەکان لە دژی خاوەن موڵکەکان هان بدەن. بەڵام هیچ کام لەم ڕێگایانە جێبەجێ نەکرا.  ژمارەیەك لە شۆڕشگێڕەکان شوێنکەوتەی کارڵ مارکس بوون(١٨١٨-١٨٨٣). مارکس بە هۆی موتالاکانی لە مەڕ مێژوو، کۆمەڵگا، فەلسەفە و ئابووری ئەوروپا و جیهان بناغەیەکی نوێی بۆ پێشڕەوی بزوتنەوەی شۆڕشی کرێکاری لە جیهان بونیادنا. مارکس دەیگووت (کە وڵاتانی پیشەسازی وەکوو بەریتانیا و ئەڵمان لە ڕوانگەی هێز و سەروەتەوە چاك گەشە دەکەن. خاوەن هێزەکانی



لینین ئەم وێنەیەی لە ساڵی ١٩١٩ لە جەژن لە مانگی پێنج لە مەیدانی سووری مۆسکۆ گرتووە. لینین لە ساڵی ١٩٢٤ لە تەمەنی ٥٤ ساڵیدا کۆچی دوای کرد.




جەنگی ڕوسیە و ژاپۆن. سەربازە ڕوسیەکان، لە جەنگی ١٩٠٤ لە مەنچوری خۆیان ئامادە دەکەن لە ناوچەیەکی ژێر دەستی خۆیان پارێزگاری بکەن.

پیشەسازی (سەرمایەدارەکان) کە لە هەمان کات کاروباری وڵاتیش بە ڕێوەدەبەن، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەوڵەمەندتر دەبن، ئەو کات کرێکارەکان کە لە کارخانەکان کار دەکەن و کاڵاکان دروست دەکەن ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەژارتر دەبن. بەم پێیە شۆڕشێك بەرپادەبێت کە تێیدا هەموو کارخانەکان و کاروباری وڵاتیش دەکەوێتە دەستی کرێکارەکان.)

ئەم شۆڕشی کۆمەڵایەتیە حەتمیە چونکە ئەمە یاسای مێژووە. ئەو پێی وابوو کە شۆڕش جیا لە هەر شوێنێکی تر لە بەریتانیا و ئەڵمان ڕوودەدا چونکە ئەو دوو وڵاتانە لەو کاتەدا پێشکەوتووترین وڵاتانی پیشەسازی بوون و ژمارەیەکی زۆر کرێکاری پیشەییان هەبوو. بەڵام دواتر ڕای گۆڕدرا و پێی وابوو کە شۆڕش یەکەم جار لە ڕوسیا سەرهەڵدەدا.

لەو کەسانەی کە زیاتر لە هەر کەسێکی دیکە کەوتە ژێر کاریگەری ووتەکانی مارکسەوە (ڤیلادمێر ئیلیچ ئەلیانف) ناسراو بە "لینین" بوو. لینین لە ساڵی ١٨٧٠ هاتە دونیاوە. باوکی بەڕێوەبەری قوتابخانە بوو. برا گەورەکەی ئەلکساندر بە هۆی بەشداریکردن لە تیرۆری تەزار ئەلکساندری سێیەم لە ساڵی ١٨٨٧ لە سێدارە درا. ئەم کارە کاریگەری گەورەی کردە سەر لینین. لینین لە زانکۆ بەشی یاسای دەخوێند بەڵان دەرکرا ئەویش بە هۆی بەشداریکردنی لە خۆپیشانانەکانی دژ بە حکومەت. لە ساڵەکانی ١٩٨٠ لینین زیندانی کرا بەڵام دواتر بە هۆی بەردەوام بوونی لە چالاکیە سیاسیەکانی دورخرایەوە بۆ سیبریا. لینین و هاوڕێکانی پەرەیان بە بیرۆکەکانی مارکس دا و قوتابخانەیەکی فیکریان دروست کرد کە ئێمە ئەمڕۆ بە کومونیزم دەیناسین. لینین لەسەر ئەو باوەڕە نەبوو کە دەبێ تەنها دانیشن و چاوەڕوانی شۆڕش بن. ئامانجی ئەوە بوو کە بە هەر نرخێك بێت شۆڕشێك لە ڕوسیا وەگەربخات. بۆ ئەم کارەشی دەستی کرد بە ڕێکخستنی گروپێکی مارکسیستی، کە بە (بۆلشیڤیك واتە زۆرینە) ناسرابوون. ئەم گروپە بە هۆی ڕێنمایەکانی لینین بوون بە گروپێکی شۆڕشگێڕی لێهاتوو. لینین کەسێکی زیرەك و بە ئیرادە بوو. ئەو بە هۆی پڕ چەك بوونی بە فیکری مارکسیزم



مەلەوانەکان و هێزی دەریای ڕەش بە درێژای شۆڕشی ١٩٠٥ حۆپیشاندانیان کرد. ئەم وێنەیە گێڕانەوەی ئەو ڕوداوەیە کە لە فیلمی ڕەزمەنا و پوتمکین وەرگیراوە.

و باکگراوندێکی زانستی، لەوە دڵنیا بوو کە شۆڕشی ڕوسیە حەتمیە.

حکومەتی تەزاری ڕوسیە لە وجودی ئەم شۆڕشگێڕانەو چالاکیەکانیان ئاگاداری هەبوو. هەندێك جار ئەندامانی ئەو گروپانەی دەستگیر دەکرد. لینین ساڵانێکی زۆری لە تەمەنی بە هۆی دورخرانەوە و لە زینداندا تێپەڕاند و ڕۆژگاری دورخرانەوەکەشی  زیاترلە وڵاتەکانی سویسرا و بەریتانیا بەسەر برد.

## جەنگی ڕوسیا و ژاپۆن

لە ساڵی ١٩٠٤ ڕوسیا بۆ بەدەستهێنانی سەرزەوی زیاتر وەکوو کۆریا و ئەیالەتی مەنچووری، لە گەڵ ژاپۆن کەوتە جەنگەوە. (بگەڕێوە بۆ کتێبی بونیادنانەوەی ژاپۆن لەم زنجیرەیە). لەم جەنگە ژاپۆن سەرکەوت و تەزار و حکومەتەکەی کەوتنە barودۆخێکی خراپەوە. بەڵام تەزار و چواردەورەکەی لەوە نیگەران نەبوون کە شتانێکی زۆریان لەم جەنگە لە دەستدا داوە، بەڵکو زیاتر بە هۆی شەرمەزاریەوە بوو. لەبەرئەوەی ڕوسیا زیاتر لە چوار سەد ساڵ خۆی وڵاتانی ئاسیای سەرکوت دەکرد بەڵان ئێستاکە خۆی بە هۆی وڵاتێکی ئاسیاوە شەرمەزار ببوو. شکستی جەنگ و حاڵو ڕۆژی خراپی خەڵکی ڕوسیا بووە هۆی وەدەنگهاتن و هەڵسانەوەی وەرزێرەکان و کرێکارەکان لەسەرانسەری ڕوسیا و مانیان گرت.

## شۆڕشی ١٩٠٥

لە یەکشەمەی خوێناوی کانونی دووەمی ١٩٠٥ سوپا لە جادەکانی سەنت پترسبۆرگ ڕووی لولەی تفەنگەکانیان کردە خۆپیشاندەران و دەستیان کردە تەقە کردن. بە درێژای بەهار و زستانی هەمان ساڵ، لە شارەکان خەڵك مانیان گرت و لە لادێکان خەڵك هەڵسانەوە و لە هەموو شوێنێك هێرش و کوشتار و تیرۆ دەستی پێکردبوو. لە مانگی حوزەیران مەلەوانانی جەنگی پوتیمیکین دەستیان کردە شۆڕش کردن و پاپۆڕە جەنگیەکانی خۆیان بردە



کۆبونەوەی مەجلیسی دۆما لە ساڵی ١٩٠٦. وێنەی تەزار لە پشت سەری سەرۆکی مەجلیس.

ستولی پین، سەرۆك وەزیرانی ڕوسیە تا ساڵی ١٩١١ بە شێوەیەکی توندوتیژ هەموو شۆڕشەکانی سەرکوت دەکرد.



کەنار دەریای ڕەش و کەرەستە سەربازیەکانی کەنار دەریایان تۆپباران کرد. لە مانگی تشرینی یەکەم بە هۆی مانگرتنی سەرتاسەری کە دە ڕۆژی خایاند هەموو شتێك لە کار کەوت.

لە کۆتایدا تەزار ناچار بوو کە گۆڕانکاری لە حکومەتدا بکات. تەزار لە بەیاننامەی ئۆکتۆبەر(تشرینی یەکەم) قەولی دا کە پەرلەمان یان دۆما دروست بکات. بڕیار وا بوو کە لە دۆمادا ئەندامەکانی لە چینی جیاوازی خەڵك بێت و لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە بێت بەڵام کارەکەی تەنها ڕێنمایی کردنی تەزار بوو لە چلۆنایەتی بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات. و ئەمەش بۆ حاڵی خەڵکی ئاسایی دەوای دەرد نەبوو.

شۆڕشی ١٩٠٥ بە هۆی چەندین هۆکارەوە شکستی هێنا. تەزار بە پەسەندکردنی مەشروتیەت و دروستکردنی دۆما پشتیوانی خەڵکە دەوڵەمەندەکەی بەدەستهێنا ئەوانەی کە خوازیاری چاکسازی ئارام بوون. بەڵام زۆربەی خەڵك چاوەڕوانی چاکسازی خێرا و ڕیشەی بوون و لە دامەزراندنی دۆما گلەییان هەبوو. ئەوان پەرلەمانێکیان دەویست هاوشێوەی پەرلەمانی فەڕانسە و



**سەربازانی ڕوسیا لە سەر ڕێگا بۆ بەرەکانی جەنگ. لە جەنگی جیهانی یەکەم بۆ خواردن لە ڕێگا وەستاون. ئاپریلی ١٩١٥.**

بەریتانیا، پەرلەمانێك کە زۆرینەی لە چینی خەڵك بێت و بەڕێوەبەری کاروباری وڵات بن. بەم شێوەیە نەیارانی تەزار دابەش بوون. هەروەها هەندێك لە ئەوانەی خوازیاری چاکسازی بوون ترسیان لە شۆڕش هەبوو و دەیانویست ئارامی و ئاسایش بەرقەرار بێتەوە. شۆڕشگێڕەکان کە هومێدەواربوون ڕەوشی ژیانی خەڵك لە ڕوسیا گۆڕانکاری بە خۆیەوە ببینێت ژمارەیان کەم بوو و کرێکارەکانیش ئیتر توانای مانگرتنیان نەمابوو. بەڵام گرنگترین شت پۆلیس وسوپا بوو کە بە تەزار وەفادار مابونەوە و کاریان سەرکوتکردنی شۆڕشەکانی شارو لادێکان بوو.

تەزار لە حکومەتکردن بەردەوام بوو. ئەو دەیتوانی دۆما لەبەرچاو نەگرێت و هەر شتێك بە دڵی نەبێت پوچەڵی بکاتەوە. کەسێکی بە توانا و فێڵباز "پیتەر ستولی پین" سەرۆك وەزیران بوو هاوکاری سەرەکی تەزار نیکۆلاسیش بوو. ئەو داوای لە تەزار کرد کە هەندێك چاکسازی لە زەوی و زار و فەرهەنگدا بکات کە بە شێوەیەکی کاتی جوتیارەکان ڕازی بکات. ئەو ئومێداوار بوو کە وەرزێرە دەوڵەمەندەکان کە چاویان لە ڕێگای چاکسازی بوو بێنە ژێر ئەو باوەڕەوە کە ڕێ لە شۆڕش بگرن. لە سەروی هەموو شتێکەوە ستولی پین دەیویست کە سوود لە سامانی سیبریا وەربگرێت و پێی وابوو کە ئەگەر زۆربەی خەڵکی ڕوسیای بەشی ئەوروپا بنێرێتە سیبریا، بابەتەکە چارەسەر دەبێت. لە ساڵی ١٩١١ ستولی پین تیرۆر کرا. چەند ساڵ دوای کوژرانی ستولی پین سەراسەری ڕوسیا هەر لە مانگرتن و شۆڕشدا بوو. کاتێك لە ساڵی ١٩١٤ جەنگ لە نێوان ڕوسیەو ئاڵمان دەستی پێکرد، تەزار بەو هومێدەوە دڵ خۆش بوو کە جەنگ دەبێتە هۆی یەکگرتووی خەڵکەکەی و دەبێتە هۆی پەتەوکردنی حکومەتەکەی. هەندێك لە وەزیرەکانی ترسی ئەوەیان هەبوو کە ئەم جەنگە بە شۆڕش کۆتایی پێ بێت. لە لایەکی دیکەوە لینین شۆڕشی بە پێویستیەکی مێژووی دادەنا. ئەو بۆی دەرکەوتبوو کە ڕوسیا نەیدەتوانی بەرگەی جەنگێکی درێژ بگرێت. (بگەڕێوە بۆ دوو جەنگی جیهانی لەم زنجیرەیە)



خۆپیشاندان لە بەرامبەر کۆشکی زستانە پەتروگراد ساڵی ١٩١٧.

## جەنگی جیهانی یەکەم

جەنگ بەڵایەکی گەورە بوو بۆ ڕوسیا. لە ماوەی دوو ساڵ و نیوی سەرەتای جەنگ، زیاتر لە پێنج ملیۆن نەفەر بوونە قوربانی. لە زۆربەی بەرەکان لە خەتی پێشەوەی شەڕ، سەربازەکان ناچار بوون کە بە دەستی بەتاڵ شەڕ بکەن چونکە هەموو هێڵەکانی گواستنەوە لە کار کەوتبوون و کارێکی دژوار بوو کە چەك و چۆڵ و لە هەموو گرنگتر خۆراك بگاتە دەستیان. هەڵبەت لە هێڵی پشتەوەی جەنگیش بارودۆخەکە لەوە باشتر نەبوو. لە شارە گەورەکان لە کارکەوتنی هێڵی گواستنەوە و ڕاگەیاندن بە مانای کەمبودی خۆراك و سوتەمەنی بوو کە بووە هۆی مانگرتنی خەڵك.

کاتێك تەزار نیکۆلا بڕیاری دا بۆخۆی فەرماندەیی جەنگ بگرێتە دەست و بچێتە بەرەکانی جەنگ کاروباری وڵاتی دایە دەست هاوسەرەکەی، تەزارینا. ئەو ژنێك بوو کە بە تەواوی لە ژێر کاریگەری ڕۆحانیەکی کەلیسا بوو بە ناوی ڕاسپۆتین. هەر کاتێك یەکێك لە وەزیرەکانی تەزار شتێکی دژ بە تەزار گوتبا ڕاسپۆتین تەزارینای وا لێدەکرد کە ئەو وەزیرە لە کار دووربخاتەوە. بەم پێیە حکومەتی ڕوسیا تەواو لە کار کەوتبوو کە هەرجارەو وەزیرێکی نالایەق لادەچوو و وەزیرێکی دیکەی ناشایست شوێنی ئەوی دەگرتەوە. لە دوانزە مانگی کۆتایی حکومەتەکەی تەزار زیاتر لە چوار سەرۆك وەزیر، سێ وەزیری دەرەوە و سێ وەزیری جەنگ گۆڕدران.

لە ساڵی ١٩١٧ جوتیار و کرێکارەکان لە جەنگ وەڕەز بوون. ملیۆنان نەفەریان بە زۆری ڕەوانەی جەنگ کردبوو. بەرهەمە خۆراکیەکان بە تەواوی وەستابوون و نرخەکان بێ حساو زیادی کردبوو. گەندەڵی و لاوازی سیستەمی حکومەت ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر دەردەکەوت. زۆربەی خەڵك چاوەڕێی حکومەتێکی بە هێز بوون کە بێت و ڕزگاریان بکات لە دەست ئەم جەنگ و نەهامەتیانە. هەتا هەندێك لە ئەشرافزادەکانیش کە پێشتر لایەنگری تەزار بوون ئێستا دەستیان کردبوو بە پلان داڕێشتن بۆ لە ناوبردنی تەزار. حکومەتی ڕوسیە لەبەردەم شکستدا بوو. ئەم بارودۆخە بۆ شۆڕشگێڕەکان کە دەیانویست ڕیشەی ئەم حکومەتە لەبنەڕەتدا هەڵکەنن تەواو لە بار بوو.

## شۆڕشی شوبات

لە کۆتایەکانی شوباتی ١٩١٧، مانگرتن و هەستانەوە شاری پێتروگرادی(سەنت پیتەرزبۆرگ) داگرتبوو. دەوڵەت دەستووری بە سەربازەکان دا کە خۆپیشاندانەکان سەرکوت بکەن. تەزار بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی دوٚمای دا، بەڵام نوێنەرانی پەرلەمان لە کۆبونەوەیکدا خۆیان وەکوو حکومەتی کاتی ڕوسیا ناساند. ڕۆژێك دواتر دەسەڵات لە تەزار سەنرایەوە. بە درێژای شەش مانگ دواتر حکومەتی کاتی دەستی دایە چاکسازی بێ ئەنجام. ڕێبەرانی ئەم حکومەتە کاتیە شۆڕشگێڕان و چاکسازانی میانەڕەو بوون. ئەوان تەنها دوو ئامانجیان هەبوو، یەکەم ئەوەی کە لە جەنگی دژ بە ئەڵمان سەرکەوتن بەدەست بێنن، و دووەم هەڵبژاردنێك ساز بکەن بۆ دامەزراندی پەرلەمانێکی نویێ، و دواتر پەرلەمان دەبێت بڕیار بدات کە دەبێ چ گۆڕانکاریەك بکرێت. بەڵام حکومەتی کاتی، ئەوەندە هێزی نەبوو کە بتوانێ وڵات بەڕێوە بیات. لە سەرانسەری ڕوسیە، وەرزێرەکان، کرێکارەکان و سەربازەکان بۆ خۆیان شوراپان دروست کرد و توانیان کاروباری ناوچەیی خۆیان هەڵسوڕێنن. بەهێزترین شوڕا لە پایتەخت، یانی لە پتروگرات بوو. ئەم شوراپە ڕێکخستنێکی ئەوەندە بە هێزی هەبوو کە لە ناو کرێکاران پشتیوانیەکی زۆری هەبوو و دەکرا لە تەنیشت حکومەتی کاتی وەکوو حکومەتێکی بەهێز حساوی بۆ بکرێت. لە لادێکان ئەمن و ئاسایش تێك چوو گوندنشینەکان دەستیان کرد بە دەستبەسەرداگرتنی زەوی خاوەن موڵکەکان. لە بەرەکانی جەنگیش هەزاران سەرباز کە زۆربەیان جوتیار بوون هەڵاتن و گەڕانەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان. زۆرێك لە



کیرەنسکی (دەستی چەپ) لە بەرامبەر تێپەڕبوونی سەربازەکان سڵاوی سەربازی کردووە. وتارێژێکی زیرەك بوو. بەڵام حکومەتە کاتیەکەی ئەو نەیتوانی کە کۆتایی بە جەنگ بهێنێت و لەبەرامبەر بۆلشیکەکان شکستی هێنا. کیرەنسکی بەرەو ئەمریکا هەڵات و لەوێ بوو بە مامۆستای زانکۆ لە بەشی مێژوو.

نەتەوەکانی دیکەش حکومەتی سەربەخۆیان دروست کرد و لە ڕوسیە جیاوەبوون.

کاتێك شۆڕشی شوبات دەستی پێکرد لینین ئەوکات لە سویسرا بوو. ئەو ناکۆك بوو لە گەڵ سیاسەتی حکومەتی کاتی و دەیوست بگەڕێتەوە بۆ پەتروگراد(سەنت پترسبۆرگ)، و بۆلشەڤیەکەکان کە ئامادەی وەدەستگرتنی حکومەت بوون پێکبهێنێت. ئەڵمانیەکان دەیانویست هەرچی زیاتر حکومەتی ڕوسیا بخەنە ژێر فشارەوە و لە جەنگ بیبەزێنن، ڕەزامەندیان نیشان دا کە لینین بە ئەڵماندا تێپەڕێ، ئەویان خستە ناو شەمەندەفەرێکەوە و لە ئەڵمان و سویدەوە تێپەڕی و لە وێستگەی فنلاند لە سەنت پترسبۆرگ دابەزی، مانگی چواری ١٩١٧بوو. هەموو



هەوەڵین سوپای سوور کە دەستیان بە سەر چەکەکانی پەتروگراد دا گرتبوو.

ڕێبەرانی بۆلشەڤیکەکان کە دوورخرابوونەوە بۆ وڵاتانی دیکە بە پەلە خۆیان گەیاندەوە ڕوسیا.

جەنگ لە گەڵ ئەڵمان بەردەوامی هەبوو. زەخیرە کەم بوو. ژمارەیەکی زۆر لە ڕوسەکان چاوەڕوانی ئاشتی بوون. لینین زۆر دژ بە جەنگ بوو و لە وتارەکانی داخوازیەکانی خەڵکی هەژمار دەکرد، دروشمی لینین بریتی بوو لە: نان، ئاشتی، ئازادی. کرێکارانی پیشەسازیە گەورەکان لە هەموو ناوچەکانی ڕوسیا پشتیوانی بۆلشەڤیەکەکان بوون کە کاروباری شوڕای سەنت پترسبۆرگیان لە دەست بوو. لە مانگی حوزەیران بۆلشەڤیەکان ویستیان حکومەت بگرنە دەست بەڵاں سەرکەوتوو نەبوون. دواتر لە مانگی ئاب( مانگی ٨) ، ژەنەڕاڵێکی ڕوسی، بە ناوی کرۆنیلۆف، هەڕەشەی ئەوەی کرد بە سەربازەکانیەوە ڕێ پێوانێك دەکات بەرەوە سەنت پترزبۆرگ و حکومەت دەگرێتە دەست. کیرەنسکی ڕێبەری حکومەتی کاتی کە ترسی لەم ژەنەڕاڵە هەبوو بۆیە کرێکارەکانی شوڕای سەنت پترزبۆرگی پڕ چەك کرد.

ئەم هێزە پڕچەکە، بە گاردی سوور(پاسەوانی سوور/ سوپای سوور) ناسرابوون، ئامادە بوون کە پارێزگاری لە شارەکە بکەن. شەڕێکی قورس ڕویدا، کرێکارەکانی ڕێگای شەمەندەفەر ڕێگاکانی جوڵەی سوپاکەی کرۆنیۆڵفیان بۆ شارەکە خراپ کرد. گاردی سوور و کرێکارەکانی پەتروگراد، داوایان لە سەربازەکان کرد کە شۆڕش بکەن. لە ئەنجامدا پلانەکەی کرۆنێۆلف بۆ داسەپاندنی شۆڕش پۆچەڵ بویەوە. بۆلشەڤیکەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە پایتەخت، دەسەڵاتی زیاتریان بەدەست دەهێنا. ئەوان ڕێکخستنێکی پتەویان هەبوو کە لە لایان کرێکارانی چەکدار و سەرباز و مەلوانەکان پشتیوانیان دەکرا. لەم قۆناغەدا، لینین گەیشتە ئەو باوەڕەی کە ئیتر کاتی ئەوەیە حکومەت بگرێتە دەست.



**له شوڕشەکانی تەمووز ١٩١٧ پەتروگراد، خۆپیشاندەران له بەرامبەر سەربازانی حکومەتی کاتی هەڵدێن.**




**پەتروگراد له ساڵی ١٩١٧**



لینین بە کۆنگرەی شورا دەڵێت کە دەسەلاّت بگرنە دەست. تشرینی یەکەمی ١٩١٧، ئەم تابلۆ خەیاڵیە یەکێك لە هونەرمەندانی یەکێتی سۆڤیەت دروستی کردووە، لەپاش مەرگی لینین کێشراوە.

## شۆڕشی ئۆکتۆبەر (تشرینی یەکەم)

لە ١٠/٢٤، گاردی سووری و بۆلشەڤیکەکان بەرێکەوتن بۆ بارەگای سەرەکی حکومەتی کاتی. ئەوان ئەو پردانەیان کۆنترۆڵ کرد کە لە سەر ڕوباری نیوا بوو، دەستیان بەسەر هەموو بینا حوکومیەکاندا گرت و لە کۆتایدا بە ڕێکەوتن بۆ کۆشکی زستانە کە حکومەتی کاتی لە وێدا کۆبوونەوەی هەبوو. لە ماوەی چەند ڕۆژێك پەتروگراد، مۆسکۆ و زۆربەی شارەکانی دیکە کەوتە ژێر دەستی بۆلشەڤیەکەکان. بەلاّم کۆنترۆڵ کردنی هەموو ڕوسیا کاتی دەویست.

بۆلشەڤیەکەکان چۆن سەرکەوتنیان بەدەست هێنا؟ بۆلشەڤیکەکان، شۆڕشگێڕانی لێهاتوو، شایستەو بەنەزم بوون. ئەوان بەرنامەی نووسراویان هەبوو بۆ پەرەپێدانی ئابووری و گۆڕانکاری کۆمەلاّیەتی لە ڕوسیا، و لە لایان زۆربەی زەحمەتکێشانی ولاّت پشتیوانی دەکران. بۆلشەڤیکەکان لە مەیدانی سیاسی، زۆر بە ئاگا و چالاك بوون. ئەوان هەموو خاڵە لاوازەکانی حکومەتی کاتیان بە خەڵك نیشان دا، هەرچی لە ژێر بەرە بوو هێنایانە سەر بەرە. بەلاڕێ بردنەکانی شۆڕشیان بۆ خەڵکی ڕوون کردەوە و هەنگاو بە هەنگاو شایستەیی خۆیان بۆ ڕێبەریی شۆڕش نیشان دا.

لە هەوەڵین مانگەکانی پێکهێنانی حکومەتی بۆلشڤیکەکان، لینین ئاشتینامەیەکی جودای لە گەلّ ئەلّمان واژۆ کرد. دەستی بە سەر بانکەکاندا گرت. ئامانجی لینین، تێپەڕین لە سەرمایەداری بۆ سۆسیالیزم ودواتر بۆ کومونیزم بوو.

بگەڕێتەوە بۆ جەنگی دژ بە ئاڵمان. لە ڕۆژهەڵاتەوە، ژاپۆن و لە ڕۆژئاواوە پۆڵەند لەم نائارامیە فرسەتیان هێناو بەشێکیان لە خاکی ڕوسیە داگیر کرد. سوپای سوور خۆڕاگری دەکرد بەرامبەر سوپای سپیەکان و پۆڵەندیەکان. ئەم سوپایە یەکێك لە شۆڕشگێڕ گەورەکانی ئەو سەردەمەی ڕوسیا ڕێبەرایەتی دەکرد، کە ناوی لیئۆن ترۆتسکی بوو.

بۆ ماوەی سێ ساڵ سپی و سوورەکان پێکەوە جەنگان و لە کۆتایدا سوورەکان و کرێکارانی پیشەوەر سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. فەڕانسە و بەریتانیا کە زانیان سپیەکان زۆر بە خراپی شکستیان هێناوە ئیدی خاکی ڕوسیەیان بە جێ هێشت. بە ملیۆن ژن و پیاو لەم جەنگەدا کوژران یان لە برسان مردن. لە میانەی جەنگ، تەزار و خێزانەکەی لە دادگای شۆڕشگێڕان دادگای کران و لە سێدارە دران. ئیمپراتۆریەتی کۆنی ڕوسیە چووە زبڵدانی مێژووەوە. خەڵکی جیاوازی ڕوسیا ئێستا بە یەکێتی سۆڤیەتی سۆسیالیستی دەناسران، گەیشتن بە ئازادی و سەربەخۆی.



لیۆن تروتسکی، ڕێکخەری سوپای سوور. ترۆتسکی لە پاش مەرگی لینین لە ڕوسیا چووە دەرێ و لە ساڵی ١٩٤٠ کوژرا.

## جەنگی ناوخۆ

بەر لەوەی جەنگ لە گەڵ ئەڵمان کۆتایی پێ بێت جەنگی ناوخۆ لە ڕوسیا ڕویدا. چەند گروپێك بە ناوی سپیەکان لە گەڵ بۆلشەڤیکەکان جەنگیان دەستپێکرد. ئەمانە سوسیالیست، لیبراڵ، ناسیۆنالیست و ژەنراڵەکانی پێشووی تەزار بوون. ئەوان دەستیان کرد بە دروستکردنی حکومەتی جیاواز لە بەشە جیاوازەکانی وڵاتی ڕوسیا و دەستیان کرد بە جەنگ لە گەڵ بۆلشەڤیکەکان. بەریتانیا و فەڕانسە بۆ پشتیوانی هەندێك لەم گروپانە چەك و سەربازی بەکرێگیراوی دەنارد، بەو هومێدەی کە ڕوسیا



خوێندکاران لە کاتی جەنگی ناوخۆ دەچنە پاڵ سوپای سوور و فێری سەربازی دەکرێن.




سوپای سوور هێرش دەکاتە سەر کۆشکی زستانە. وەرگیراوە لە فیلمی سەرگی ئیزنشتاین کە بە ناوی دە ڕۆژ کە جیهانی لەرزاند.

## دروستکردنی حکومەتی شوڕاکان

ئەو نەهامەتیانەی کە جەنگی ناوخۆ بۆ ڕوسیەی هێنایە ئاراوە چەندین جار پڕ نەهامەتر بوو لە جەنگی دژ بە ئەڵمان. بەشی زۆری وڵات کاول ببوو. پیشەسازی لە ناوچوو بوو و ڕێ و ڕەسمی ژیانی خەڵك لەکارکەوتبوو. پێویستی بە دەستبەجێ هەنگاونانێك هەبوو بۆ ئەوەی ئاسایش بگەڕێتەوە بۆ وڵات و چاکسازی ئابووری بکرێت. لینین و بۆلشەڤیکەکانی دیکە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە ئامادە بوون. لینین و کرێکارەکان دەیانویست لە یەکێتی سۆڤیەت وڵاتێکی کومونیستی دروست بکەن کە پیشەسازی و کشتوکاڵ بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی کرێکاری و نەیەڵن هەموو شتێك بکەوێتە دەستی دەوڵەمەندەکان، خاوەن موڵکەکان، بە واتایەکی دیکە بەشێکی تایبەتی خەڵك. بەڵام هەتا لینین و هەموو کرێکارەکانیش بە هەموو هێزێك کە هەیانبوو نەیاندەتوانی هەموو شتێك بە ڕۆژێك بگۆڕن. لە ساڵی ١٩٢١ لینین پلانی ئابووری نوێی بە ناوی (نیپ) خستە کار. لەم سیاسەتە ڕێگەدرا کە بەشێك لە زەویەکان چەند کەسێك کاروباری خۆیانی پێ بەڕێوە ببەن. حکومەت کۆنترۆڵی بەشە گرنگەکانی کرد وەکوو ڕێگای شەمەندەفەر، بانکەکان و کارخانە گەورەکان. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کارخانە و کێڵگە بچوکەکان هەروا لە دەستی بەشێکی تایبەت بمێنێتەوە.

لینین ئەم سیاسەتەی بە هۆی پێویستی ڕۆژ بە خاتری بارودۆخی خراپی ڕوسیا جێبەجێکرد. دواتر لە سەردەمی ستالین، کاتێك کە ڕوسیا بارودۆخێکی ئابووری جێگیری بەدەست هێنابوو خاوەندارێتی حکومەت بەرفراوانتر بوو. لەو سەردەمەدا یەکێتی سۆڤیەت بە تەواوی لە نەهامەتیەکانی جەنگی ناوخۆ ڕزگاری بوو. گۆڕانکاریە ئابووریەکان کەم کەم کەوتنە گەڕ و هەروەها هێزیش بە تەواوی کەوتبووە دەستی حیزبی کومونیست( کە ناوی نوێی بۆلشەڤیەکەکان بوو) و حیزب و ڕێکخراوە



جەنگی ناو خۆیی و دەستەوەردانی وڵاتانی دەرەکیش لە کاروباری ناوخۆی ڕوسیا بووە هۆی نەهامەتی و قاتوقڕی. پەناهەندەی برسی لە سامارا لە ساڵی ١٩٢١.

سیاسیەکانی دیکە هەڵوەشانەوە. یەکێتی سۆڤیەت لە ڕێگای نوێوە بەرەو ئاسۆیەکی ڕۆشن هەنگاوی دەنا.

## کاریگەری شۆڕش لە سەر یەکێتی سۆڤیەت

شۆڕش سەوقاتی گەورە و پایداری بۆ ڕوسیا هێنا. سیستەمی حکومەتی تەزار بە تەواوی لە ناوچوو وسیستەمی سۆسیالیستی جێگای گرتەوە. لە سیستەمی کۆن، تەزار و وەزیرەکانی وەکوو دیکتاتۆر وڵاتیان بەڕێوە دەبرد. بەڵان دوای ١٩١٧، حیزبی کۆمونیست ئیدارەی وڵاتی گرتە دەست. تەزار و ئەوانەی دەوروبەری حکومڕانانێکی خۆویست بوون کە تەنها و تەنها مەنفەعەتی چینی ئاغاکان و دەوڵەمەندەکان بۆیان گرنگ بوو. بەڵام حیزبی کومونیست مافی لێقەماوان و بەشخوراوان و وەرزێرەکانی کردبووە بەرنامەی سەرەکی خۆی. تەزار خەڵکی بە زۆری کەلیسا هەڵدەخەڵەتاندو خۆی وانیشان دەدا کە مەسیحیەکی ئۆرتۆدۆکسیە. بەڵام حکومەتی نوێ خوێندن و فێربوونی بە گرنگترین شت دەزانی.

لینین پێی وابوو کە کرێکارەکان دەبێ ئیدارەی کاروباری خۆیان لە شوڕای کرێکاری وەدەست بگرن. پیشەسازی وڵات ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەی دەسەند. لینین دەیویست یەکێتی سۆڤیەت بیێتە وڵاتێکی بەهێزی پیشەسازی جیهان. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژمارەی کرێکاری پیشەسازی زیادی دەکرد و حکومەتی کرێکاری یەکێتی سۆڤیەت بەهێزتر دەبوو. هەموو سەندیکا و ڕێکخراوەیە کرێکاریەکان و ڕۆژنامەکان لە ژێر چاوەدێری حکومەتی نوێ بوون.

یەکێك لە گۆڕانکاریەکانی ئەخیر کە لەوێدا ڕویدا بریتی بوو لە کۆنترۆڵ کردنی پیشەسازیەکان لە لایەن دەوڵەتەوە، بە هۆی ئەم هەنگاوە و گۆناڕانکاریە بنەڕەتیەکان ، دوای زیاتر لە ٦٠ ساڵیش خەڵك هەر پێیان وابوو کە هیچ



خۆپیشاندانەکانی مانگی ئاپریل لە پەتروگراد ساڵی ۱۹۱۷

سیستەمێك وەكوو سیستەمی كومونیستی نەیدەتوانی وڵاتێكی ئەوا زەبەلاحی وەكوو ڕوسیا ئیدارە بكات.

## شۆڕشی ڕوسیا و شۆڕشی جیهانی

شۆڕشی ئۆكتۆبەر هەوەڵین شۆڕشی سەركەوتووی كرێكارانی جیهان بوو كە توانی زاڵ بێت بەسەر هەموو پلان و هێرشەكانی دژە شۆڕش و پلان و هێرشەكانی ئیمپریالیستی ناوخۆیی. توانی ئابووری سۆسیالیستی ڕێكبخاتەوە وهەوەڵین حكومەتی كرێكاری بوو توانی وڵات بەرێتە ڕیزی پێشكەوتوترین و بەهێزترین وڵاتانی پیشەسازی. ئەم شۆڕشە پاشخانی هەموو شۆرشەكانی دواتر بوو و خاڵی وەرچەرخان بوو لە مێژووی بزوتنەوەی كرێكاری. بۆ هاوكاریكردنی بزوتنەوەی كرێكاری، لینین كومونیستی نێونەتەوەی دروست كرد ( كومینترن ) بۆ ئەوەی بتوانێ یارمەتیدەری بزوتنەوە كومونیستیەكانی جیهان بێت.

یەكسەر دوای شۆڕشی ئۆكتۆبەر، زۆرێك لە حیزبەكان كە خۆیان بە شۆڕشگێڕ ناودەبرد، لە ئاڵمان و هەنگاریا و وڵاتانی دیكە سەریانهەڵدا. بەڵام ئەوان زیاتر لە چەند مانگێك بەردەوامیان نەهێنا. چونكە حكومەتە فاشیستیەكان زۆر بە توندی سەركوتیان كردن. بەڵام كومینترن هەروا بەردەوام بوو بۆ هاوكاری كردنی حیزبە كومونیستیەكانی جیهان بۆ ئەوەی هێز بە دەست بێنن لە یەكێتیە كرێكاریەكان و بتوانن بزوتنەوەیەكی دژە ئیمپریالیستی پێك بهێنن. هەڵبەت ئەم یارمەتی و هاوكاریەی لینین و حیزبی كومونیستی گومان و نیگەرانی حكومەتەكانی دیكەی لێكەوتەوە. ئەم ڕێكخستە نوێیە ترسێكی لای وان دروست كردبوو، لەبەرئەوە بە بیانوی جیاواز پەیوەندیەكانیان لە گەڵ ڕوسیا دەپچڕی. یەكێتی



**باریکارد لە مەیدانی ئاربات لە مۆسکۆ ١٩١٧**

سۆڤیەت تا ساڵی ١٩٣٤ نەیتوانی بچێتە ناو کۆمەڵەی نەتەوەیەوە.

ستالین کە لە دوای لینین حکومەتی گرتە دەست دەیوت کومونیستەکانی ڕوسیا نابێت بیر لە سەرەتای شۆڕش بکەنەوە. ئەوان دەبێت بەر لە هەموو چتێك بیر لە بونیادنانی و باشتر کردنی وڵاتەکەیان بکەنەوە بۆ ئەوەی بتوانن ڕوسیایەکی بە هێز و وڵاتێکی سۆسیالیستی بە توانا بونیاد بنێن، دواتر دەتوانن هاوکاری خەڵکانی جیهان بن بۆ دوستکردنی حکومەتی خۆیان.

## شۆڕشی ئۆکتۆبەر و جیهان لە حاڵەتی پێشکەوتن

کارڵ مارکس پێشبینی ئەوەی کردبوو کە شۆڕش سەرەتا لە وڵاتانی پیشەسازی پێشکەوتوو سەرهەڵدەدات، وەکوو، فەڕانسە، بەریتانیا، ئەڵمان و ویلایەتە کگرتووەکانی ئەمریکا. هەڵبەت دوایە گومانی بۆ دروست بوو کە شۆڕش سەرەتا لە ڕوسیاوە سەرهەڵدەدات، کە واش بوو. زۆربەی خەڵکی ئەم وڵاتە وەرزێر بوون، ئەم وڵاتە لە ڕوانگەی پیشەسازیەوە لە قۆناغی سەرەتایی بوو کە کەم کەم گەشەی دەکرد. بۆ زانیاری زیاتر دەتوانی بگەڕێیەوە بۆ کتێبی ئیمپریالیزم کە لینین نوسیەویەتی لە ساڵی ١٩١٦.

بە پێی ئەو کتێبە، سەرمایەدارانی وڵاتانی پیشەسازی بۆ بەدەستهێنانی سوودی زیاتر، سەروەت و سامانی وڵاتانی



(هەوەڵین خۆبەخشانی سوپای سوور)

هەژار بۆ خۆیان دەبەن. لەبەرئەوە ئەمە تەنها ڕوبەڕووبونەوەی نێوان هەژار و دەوڵەمەند نییە بەڵکو ڕووبەڕوبونەوەی نێوان دەوڵەمەندان و نەتەوە هەژارەکانن. ئەم نەتەوە هەژارانە لە وڵاتانێك بوون کە وڵاتە دەوڵەمەندەکان دەیانتوانی سوودیان لێ وەبینن. ئەم وڵاتانە موستەعمەرەکانی ئەوروپا و وڵاتە لاوازەکانیشی دەگرتەوە، بۆنموونە چین. بە بڕوای لینین ڕوسیاش بەر لە ساڵی ١٩١٧ وڵاتێکی لەم جۆرە بووە. وڵاتێك کە وڵاتەکانی دیکە دەیانچەوساندەوە، لەبەرئەوەی سەرمایەدارانی ڕۆژئاوا بە هۆی دروستکردنی ڕێگای ئاسنی و پیشەکانی دیکە خۆیان بە خاوەن پشك دەزانی.

بیرۆکەکانی لینین کاریگەری قوڵی کردە سەر خەڵکی ئاسیا و ئەفریقا. بۆ هەندێك لە نەتەوەکان هۆکاری بەدبەختیان بۆ ڕوون بووەوە کە چیە. سەرکەوتنەکانی لینین و حیزبەکەی بووە هۆی ئەوەی کە خەڵکانی دیکە چاو لەوان بکەن و ڕێگای ئەوان بگرنە بەر.

بۆنموونە باوەڕەکانی کومونیستی کاریگەری زۆری کردبووە سەر چین. وڵاتێك کە نزیکەی سەدەیەك جڵەوی بە دەست هێزی بازرگانی و چەوسێنەری ڕۆژئاوا بوو. ماو تسۆتنگ ئیلهامی لە وتەو بیروڕاکانی لینین وەرگرت و ڕێبەرایەتی هێزی کومونیستی چینی کرد و دوای بیست

ساڵ خەباتی چەکدارانە چین لە شۆڕشی ١٩٤٩ سەرکەوتنی بەدەست هێنا. (بگەڕێوە بۆ شۆڕشی چین لەم زنجیرەیە)

ئەمڕۆ کومونیستەکان و لایەنگرەکانیان بۆ شۆڕش لە وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقا و ئەمریکای لاتین دەیانهەوێ بەو ڕێچکەیەدا بڕۆن کە لینین و شۆڕشگێڕەکانی دیکە پێیدا ڕۆشتوون.